له سیدره موتتەهای سەیرو (صفیر)ی پەڕی جبرییل بوو
تەجەللی ئاگرەو پەڕ ، پووشەکەی ئەم وەردو هەردانە[٦]

---

له سالّی ۱۷هـ ٦۳۸ م قدس گیرا لەلایەن حەزرەتی عومەرەوە ، وە خۆی تەشریفی برد بۆ قدس ، لەوێ بە « بطریکی ایلیا »ی ووت که شوێنێکی نیشان بدات بۆئەوەی که بیکات به مزگەوت ، ئەویش شوێنەکەی هەیکەلی سلێمانی نیشاندا ، وە عومەر مزگەوتێکی لێ دروستکرد .

له سالّی ۷۲ هـ ٦۹۱ م عبدالملکی کوڕی مەروان فەرمانیدا به دروستکردنی ئەم مزگەوتەی که تائێستا بەپێوەیە ، وە هەرچی ئەیبینێ سەری سوڕ ئەمێنێ . لەورۆژەدا گەورەترین ئەندازیاری جیهانی هێنایە سەر ، وە گەورەترین‌و جوانترین مزگەوتی لێ دروستکرد ، که تائێستا شتیوا دروست نەکراوە .

له سالّی ۲۱٦ هـ ۸۱۳ م مأمونی عەباسی دەستیکرد به جوانکردن‌و نەقش‌کێشانی .

له سالّی ۱۰۹۹م صەلیبی قودسیان گرت، وە ئەو مزگەوتەیان کرد به کەنیسە ، وە هەرچی شوێنەوار « آثار »ی ئیسلامی بوو هەموویان سڕییەوە .

له سالّی ۱۱۸۷م سلطان صلاح‌الدین قودسی گرتەوە ، وە مزگەوتەکەی کردەوە به مزگەوتەکەی جاران ، زۆر بەجوانترو گرنگتر .

له سالّی ۱۳۲۷م محمدی کوردی قلاوون دەستێکی جوانی بەسەرا هێنا ، وە نەقشکاری‌یەکی زۆر چاکی کرد .

له سوڵتانەکانی ئەستەمبووڵ سڵتان سلیم‌و سلطان سلیمان‌و عبدالعزیزو عبدالحمید هەمیشە دەستیان تیا بووە .

لەدوای جەنگی تێکڕایی جیهان ، ئەنجومەنێکی ئیسلامی ڕێك‌خرا ، وە له سالّی ۱۳٤۲وەوە تا سالّی ۱۳۵۸ هـ به کوششی حاجی امین افندی حسەینی دەستیانکرد به پارە کۆکردنەوە لەناو هەموو حکوماتی ئیسلامی‌دا بۆ دەست بەسەرا هێنانێك‌و تازەکردنەوەی نەقش‌و نقوشی . خولاسە ئەودتی ئەو مزگەوتە دروستکراوە تا سالّی ۱۹٤۸ مسلمانان به گیانێکی ئیسلامی‌یەوە چاودێریی‌و ئاگاداریی‌یان کرد ، بزانین لەمەولا چۆن ئاگاداریی ئەکری .

(٦) سیدره : ناوی درەختێکه له نزیك « جنة المأوی »وە ، وە هەرچی گوفتارو کرداری بەندەگان هەیە ــ که بەرز ئەکرێنەوە ــ تا ئەوێ ئەڕۆن ،

هەتا جێ پێ مەکانێ بێ ، ڕێی ئەرواحی نەبی بێبوون
خودا خۆی پەس نیگەهبانە ، لەوەولا ، لامەکانانە [٧]

سەریرارا شەهەنشاهێ کە فەرقی عەرشە کورسی پێی
سەرم سەرگەردی پێی ، روحم فدای ئەو شاهی شاهانە [٨]

هەر ئەو شەو ، ئەو سەعاتەو ، ئەو دەقیقەو ، ثانیەو ، لەحزە
خەلاتیدا بەشانا شا ، عەجەب لەم شەوکەتو شانە

لە معراجی محمددا حکەم خوا خۆی ئەزانێو خۆی
سوئال فەرموو بچووکێکیان تۆ لەم گەورەی نەزانانە [٩]

---

هەروەك فریشتەش تائەوێ ڕێیان هەیە بڕۆن ، لەوەولا ئیتر کەس نازانێ چیە . سەیر : ووشەیەکی عەرەبیە ، بەمانا ڕۆینە . صَفیر : دەنگی پەڕو باڵی جبریلە ، واتە تا « سیدرة المنتهی » جبریل توانی لە خزمەت پێغەمبەرا بڕوات ، لەوێ ئیتر وێستاو نەیتوانی پێشکەوێ ، چونکە نووری تەجەللای خوا وەك ئاگرو ، پەڕو باڵی جبریلو میکالیش وەك پووشی ئەم ناودۆڵو دەرەو ، وەردو هەردانە وایە .

(٧) واتە هەتا جێگا پێیەك لە مەکانو ڕێگای ئەرواحی پێغەمبەران بووبێ ، هەموو لەگەڵیا بوونو ڕەوانەیان کرد ، دوای ئەوەی کە جێگا پێیەك نەما لە مەکان ، وە کەوتنە چۆڵی لامەکانەوە ، ئیتر خوا خۆی ئاگادارو نیگەهبانی پێغەمبەرە .

(٨) سەریر : تەختی لەسەر دانیشتن . سەریرئارا : کەسێکە کە بە گەورەییو ڕێزی خۆی ئارایشی ئەو تەختە بدات کە لەسەری دائەنیشێ وەك ووتەی «مجلس‌آرا » کە بە یەکێکی قسەخۆشی نوکتەزان ئەووترێ کە هەر حەز بکەیت لەگەڵیا دانیشییت . عەرشو کورسیی : زۆر جار لە قورئانا ناو ئەبرێن ، وە مەبەس لەمانە هەر تصویری گەورەیی خوایە . واتە ئەم پێغەمبەرە گەورەیە ــ کە شەهەنشاهی هەموو پێغەمبەرانە ــ لە شەوی معراجا گەیشتە شوێنێك کە «عەرش» کەوتبووە لای سەریو «کورسی» کەوتبووە لای پێی .

(٩) حکم : جمعی حکمەتە ، واتە لە معراجی پێغەمبەرا ئەوەندە حکمەتی تیایە، مەگەر خوا خۆی بزانێ ، بەڵام من ــ کە سەرکردەی نادانانو نەزانانم ــ

فەلەك « یا لیتنی کنت ترابا »ی هێندە خوێند گریا
لێلاویی چاوی داهات‌و دیاریی دا تیا تانە

جەواهێر سورمەیی تۆزی بەری نەعلەینی بۆ هەڵگرت
لە کاخی خاکەوە سەرکەوت‌و پێی نایە سەر ئەم بانە (١٠)

( طی )و پەی‌کرد رەهو پەردە ، سوئالی کرد جەوابی گرت
عەجەب بازانە بازانە چوو هاتو باز هەر ئەو ئانە (١١)

---

حکمەتێکی بچکۆلانەی لێ ئەزانم ، ئەگەر پرسـیاری ئەو حـکمەتەم لێ بکەیت لە شعری دوایی‌دا بۆت باس ئەکەم .

(١٠) فەلەك : ئاسمانە . تانە : خاڵێکی سپی‌یە ئەکەوێتە سەر هێنێ چـاو ، بینینی نامێنێ . جەواهیر سورمە : دەرمانێکی زۆر باشە کە بە چاوا هات، رووناکی ئەکاتەوە . کاخ : کوشك ، لەگەڵ خاکا جناسی مقلوبی تیـایە . سەر ئەم بانە : کە ئاسمانە ، واتە ئاسمان حەسەدی برد بە زەویی ، کەوا پێغەمبەر لەسەر پشتی ئەوەو بەسەریا ئەروات ، وە ئەمیش بێ‌بەش ماوە لێی ، لەبەرئەوە هەمیشە وەك ویرد ئایەتی « یا لیتنی کنت ترابا »ی ئەخوێند ، واتە خۆزگە منیش وەك زەویی خاك بوومایە ، تا حەزرەتـی محمد پێی پیا بنامایە . ئنجا ئەم ئایەتەی ئەوەنـدە خویندو گریـا تـا لێلاویی داهات‌و چاوی سپی هەڵگەڕاو تانەی کەوتە سەر بەم ئەستێرانە.

ئنجا پێغەمبەر تەشریفی برد بۆ ئاسمان ، تا تۆزی ژێر سۆلەکانی بـۆ بەرێ‌و وەك جەواهێر سورمە بیهێنێ بە چاوی ئاسمانا تا تۆزی ئاواتی بێتـەدیی .

(١١) لە باسی معراجا زانایان ئەڵێن : پێغەمبەر لە مسجد الحرام نوستبوو کە جبرییل هاتو خەبەری کردەوە ، وە خەبەرەکەی دایی ، ئەویش هەستـا دەست‌نوێژێکی شت‌و کەوتنەڕێ تا گەیشتنە مسجد الاقصی ، لەوێشەوە بۆ معراج تا گەیشتنە شوێنی خـۆی ، وە چەند قسەیـەکو پرسیـارو وەڵامێك ڕووی‌دا ، ئنجا گەڕایەوە بۆ ئەو جێگایەی کە تیا نوستبوو ، بینی جێگاکەی هێشتا هەر گەرم‌و گورە، وەك ئەو ساتەی کە بەجێی‌هێشتووە. ئنجا خاکیی بەم تاقە شعرە ئەم مەبەستە باس‌ئەکات .

لە ناوەندی «طی»و «پەی»و «رەهـ»و «پـەردە»دا لـەفو نـەشری مورەتتەب هەیە ، بەم‌ڕەنگە «رەهـ» بۆ «طی»و «پەردە» بۆ «پەی» ، واتـە حەزرەتی محمد ڕێی دوورو درێژی بڕیی ، وە هـەزاران پلـەی بڕیی‌و

لە خەڵوەتخانە دەرکەوت‌و لە حەوت خانەی فەلەك سەرکەوت
لە دەوڵەتخانە چوو یەك ئان ، بە دەوڵەت هاتەوە خانە (١٢)

لە بۆ کێ مومکنە ، مومکن لەگەڵ واجب مولاقی بێ
لەبۆ ئەم مومکنە ، مومکن بووە ، ثابت بە بورهانە (١٣)

نەسیمی فەیزی حەق ئەنگووت‌و غونچەی کامی پێ پشکووت
ویـــصالی جان‌و جانانە ، چ‌خۆشە ، رەبی چەند جوانە ؟! (١٤)

غەم‌و هەم عوقدەو شادیی شەل‌وپەل حەل موسەلسەل بوو
کەرەم راقی ، ئەحەد ساقی‌و ئەحمەد مەستی پەیمانە (١٥)

---

پەردەی لادا تا گەیشتە بارەگای حوزوور ، ئنجا پرسیاری کردوو وەرامی وەرگرت لە یەك چاولێکنانا، وەکوو ئەفەرموێ : عەجەب بازانە بازانە چوو، وە هاتەوە هەر لەوساتەی کە تیا چووبوو .

مەولەویش لەم مەعنایەدا ئەڵێ :

**چوو ، بوو ، دیی ، بیستی ، کریا ، دریاوە**
**هاتۆ ، حەڵقەی دەر هەر مەلەرياوە**

(١٢) خەڵوەتخانە : ئەو جێگایەیە کە حەزرەتی محمد تیا نوستبوو ، وە لەوێوە چوو بۆ معراج . حەوت خانەی فەلەك : هەوتەوانەی گەرۆك . دەوڵەتخانە: ئەو شوێنەیە کە لێوەی چوو بۆ معراج .

(١٣) زانایان ، ئەوی هەیە لەم بوونەوەرەدا ، دابەشی ئەکەن بە سێ بەش : «واجب»و «ممتنع»و «ممكن» چونکە ئەو شتە یا بوونی پێویستە وەك خوا ، ئەوە واجب الوجودە ، یا نەبوونی پێویستە وەك شەریکی خـــوا ، ئەوە ممتنعە ، یا نە بوونی پێویستەو نە نەبـــوونی ، وەك ئـــەم هـــەموو شتانەی کە بە چاو ئەیانبینین ، ئەوە ممکنە ، هیچ ممکنێك ناگونجـێ لەگەڵ واجبا کۆببێتەوە ئەم ممکنە نەبێ کە حەزرەتی محمدە .

(١٤) ئنجا باسی پیرۆزیی ئەو شەوە ئەکات ئەفەرموێ : نەســیمی فـــەیزو ڕەحمەتی خوا هەڵیکردو خونچەی کام‌و ئاواتی پێ پشکووت ، کە ئـــەو کام‌و ئاواتەش گەیشتنی پێغەمبەر بوو بۆ خزمەت خوا .

(١٥) غەم : خەم‌و خەفەت . هەم عوقدە : واتە هەروا عوقدەو گرێی ناو دڵ‌و دەروون . شادیی شەل‌و پەل : واتە خۆشی بـزرِ بزرِی دنیـــا . حـــەل :

لــه ئەحمەد تا ئەحەد میمێ بۆ فەرق‌و غەرقی وەحدت بوو
بزانە عاشق‌و مەعشوق لەم دوانە کە کێ‌یانە (١٦)

لە اسراری شەوی ئیسرا ئەگەر اظهاری سری کەم
نیــثاری پێم‌دەکەن سەریان هەچی پیشەی گوناهانە

لە سیڕی «قابە قەوسەینی‌و ئەو ئەدنی»یی ئەگەر دەدووم
رجایە جان نثارییم کەن ئەوانەی کاهلی وجدانە(١٧)

## باسی هێندێ لە معجزاتی پێغەمبەر

جیهان سایە نشینا تۆ مەگەر رۆحی نی‌یە سایەت
بەڵێ سایە وظیفەی جسمە ، جسمی تۆ هەمووی جانە (١٨)

---

رووئەکاتە غەم‌و عوقدە . موسەلسەل : ڕووئەکاتە شادیی بزڕ بزڕ ، واتە لە شەوی معراجا هەرچی خەم‌و گرێ‌یەك بوو کرانەوە ، شادیی بزڕ بزڕ وەك خۆی مانەوەو دەوامیان کرد .

کەرەم : لوتفـو میهرەبانی بەرزو بەنرخی خـوا ، ئەحــەد ســاقی : خوای تاك‌و تەنیا ، میهرەبانی خۆی کەرەم ئەکات بە پێغەمبەر . ئەحمەد : حەزرەتی محمدیش مەستی پەیمانەی لوتفـو میهرەبانی خوا بوو .

(١٦) ئەحمەد : ناوی پێغەمبەرە . ئەحەد : ناوی خوای تاك‌و تەنهایە ، ئــەم دوو ناوە بە میمێك لە یەك جیا ئەبنەوە ، وە بەمەدا ئــەزانرێ کە خــوا عاشقەو حەزرەتی محمد معشوقە ، بەم مەعنایە کە فرستادەی خوا بــۆ پایەی دواترین پێغەمبەریەتی هەر ئەبێ حەزرەتی محمد بێ ، وەك خــوا خۆی ئەفەرموێ «الله اعلم حیث یجعل رسالته» واتە خوا باشتر ئەزانێ کە فرستادەیی خۆی لەکوێ‌دا دائەنێ .

(١٧) واتە ئەگەر نهێنی شەوی ئیسرا ، یا نهێنی « قاب قوســین او ادنــای » دەرخەم لەبابەت بەخشین‌و میهرەبانی خواوە دەرحەق بە ئوممەتی محمد، لەوانەیە گوناهباران سەری خۆیان ، واتە ژیانیان بکەن بە شاباشم لــە خۆشیانــا .

(١٨) وا بڵاوە کە پێغەمبەر «درووودی خوای لێ‌بێ» سێبەری نەبووە ، ئنجــا شاعیر ئەڵێ : ئەی ئەوکەسەی کە لە سێبەری جیهانا دانیشــتوویت ،

پەس‌و پێشی دەدیی هەر دوو بە دیدەی سەر نە دیدەی سیرِ
چ‌دیدە دیویە دیدەی وا بە غەیر از ئەم دو دیدانە [19]

لە قوربی « قابە قەوسەین‌و ئەو ادنی » دڵ خەمێکی بوو
برۆی کەچ‌کردو فەرموو راستە ، دای‌دا ڕووی حەکیمانە[20]

خەلاّتی صورەتی قورئان‌و معنی هەرچی دڵ حەزکا
( فَسَلْ تُعْطَ ) لەبەینا بوو ، هەزاران سیرِی پەنهانە [21]

نە تەنها لاتی لەت‌لەت کردو لات‌ئاسا بەلادا هات
عەزای بی عیزی عوزا کەن کە سووری شیین‌و گریانە[22]

---

تۆ بۆچ گیانیت وا سێبەرت نی‌یە ؟ ئنجا خۆی وەرام ئەداتەوە ئـەڵێ : بەڵێ سایە بۆ جەستەیە ، جەستەی تۆش هەمووی هەر گیانە گیـانیش سێبەری نی‌یە ، بۆیە تۆش سێبەرت نی‌یە .

(١٩) دەنگ بلاّوە ئەڵێن : پێغەمبەر هەروەك ڕووبەڕوو شتی دیوە بە چـاو ، پاشەو پاشیش شتی دیوە ، وەکو ئەفەرموێ : پێش‌و پاشی ئەدیی بـە چاوی سەر ، نەك بە چاوی دڵ ، چ‌چاوێ ، چاوی بە چاوی‌وا کەوتووە ، بە غەیری ئەم دوو چاوانی پێغەمبەرە .

(٢٠) داڕوو : دەرمانێکە کە حەکیم داینێ لەسەر برینێ . واتە لەم پایە بەرزەی کە پێغەمبەر دەستی‌کەوت لە شەوی معراجا ، هێندێ‌کەس لە وەختی خۆیا بە شتێکی دووریان زانیوە ، کە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد ، بـە چاوو برۆ ئاماژە «ئیشارەت»ی کردن کە بەڵێ ڕاستە ، وە بەوڕەنـگە دەرمانی هەموو دوودڵی‌یەکی کردن .

(٢١) دەنگ بلاّوە کە لە شەوی معراجا خوا بە پێغەمبەری فەرموو : « سَـلْ تعطَ » واتە چی داوا ئەکەیت ، داوا بکە ، تا بتدرێتێ ، ئیتر پێغەمبەر چی داواکردبێ بە دڵ ، خوا داوێتێ ، کە یەکێك لەوانە لەفظو واتـەی قورئانە کە بە خەلاّت داوێتێ . ئنجا کەوابوو مەبەست لە صورەت لەفظە بە قەرینەی مەعنا ، نەك سوورەتەکانی قورئانە .

(٢٢) لات : بتێك بووە لەناو هۆزی «ثقیف» پەرستویانە . لات ئاسا : واتـە وەك لاتی لەبرسا مردوو . عوزا : درەختێك بووە لەناو هۆزی «غەطەفان»دا

نه هەر لەسری بە کیسرا داوو قەسری قەیسەری لەق کرد
مەهی شەق کردو داغداری شەهە جەبهەی غولامانە [٢٣]

شەهەنشەهـ مەهـ سەرییری میهری ئەنوەر ئەفسەری سەربیین
بە خورما دۆلکە ئاوی هەڵدەکیشا یەك بە دوو دانە [٢٤]

قەزا رازیی برینی حەبلی دۆلکەی بوو قەدەر تێی‌خست
جەریی بوو مووجرو لێی‌دا قسەی ووت یەك بوو لەم دوانە [٢٥]

---

پەرستراوە ، پێغەمبەر خالدی کوڕی وەلیدی نارد کە بی‌بڕێ ، ئەویـش بە تەوور تێی‌بەربوو ، پێی‌ئەووت :

**یا عزّ کفرانك لا سبحانك**
**انی رایت الله قد اهانك**

عەزای بی‌عزی عوزا کەن : واتە تەعزی‌یە بگرن بۆ بێ‌حورمەتی‌و بێ‌عیزەتی عوزا ، کەوا لە شیین‌و گریانی خۆیا سوور هەڵگەڕاوە .

(٢٣) سووری‌یە ــ کە بەدەست قەیسەری رووموە بوو ــ لە زەمانی حەزرەتی عومەرا گیرا بە خۆیو قەسری «هیرەقلە»وە ، هەروا ئێران گیرا بە خۆیو طاقی کیسرایەوە، کەوابوو ئیسلام هەروەك تاجو تەختی کیسرای ڕووخان‌و قەسری قەیسەری لەق‌کرد ، مانگیشی لەت‌کردو داغی خولامانەی نـا بە ناوچـاوانیا .

(٢٤) شاهەنشاهێکی وەك حەزرەتی محمد کە مانگ تەختی لەسەر دانیشتنی‌و ، ڕۆژی درەخشان تاجی سەرێتی ــ کرێکاریی کردووە ، وە دۆلکە ئـاوی هەڵهێنجاوە لە بیر ، هەر دۆلکەی بە دوو دەنك خورما .

(٢٥) قەدەر : ئامادەکردنی شتێکە بۆ بوون . قەزا : هێنانەدیی ئەو شتەیـە ، قەزا تەنفیذی قەدەر ئەکات ، کەوابوو خۆپاراستن لە قەدەر ئەبێ ، بەڵام لە قەزا نابێ ، ئەگێڕنەوە کە جارێك پێغەمبەر «دروودی خوای لێ بێ» لەبەر ئەشکەوتێکا ئەویستێ کە ووڕگی دابوو،خێرا لێی دوورئەکەوێتەوە، پێی‌ئەڵێن : ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە دەست قەزا ڕائەکەیت ؟ ئەویـش ئەفەرموێ : لە دەست قەزا ڕائەکەم بۆ لای قەدەر ، کەوابوو ئەم نیو شعرە کە ئەڵێ «قەزا رازیی برینی حەبلی دۆلکەی بوو، قەدەر تێی‌خست» پاش‌و پێشە ، واتە ئەبوو بی‌ووتایە : « قەدەر رازیی برینی حەبلی دۆلکەی بوو قەزا تێی‌خست » .

بنێ ئەو بیرە چەند قووڵ بوو بەقەد چاوی تەماعی من
دەسی بردو دەریهێنا بێن ئەم بازوو شانە

کە کابرا ئەم دەسەی دیی ، دەس بەدەس هات دەستی خۆی پەڵکرد
پەلی گرتو شەلی چا کرد بەڵێ دەس دەستی مەستانە (٢٦)

خۆ سجدەی دارو سجدەی بەردی زورە میسلی دارو بەرد
نە دارو بەردی تۆ ، باوەڕ بکە بەم دارو بەردانە (٢٧)

نەڵێی ئیحیای مەوتا خاصە ئیعجازی مەسیحایە
کە ئیحیای دوو کوڕەی ئەیـّووبی ئەنصاری نمایانە (٢٨)

دەزانی ڕۆژەکەی غەزوە ، غەزائی ، بێ غەزاوو ئاو
لەتینوانا ، لەتینانا ، نەماتیین ، هات سەحابانە

کەفافی شوربی خۆیانو دەوابو غەسلو دەسنوێژیان
لەبەینی پەنجەی ئاو سەرکەوتو ئەدووت عەینی رضوانە (٢٩)

---

ئنجا بەهۆی ئەوەی کە گوریسەکە بەدەست پێغەمبەرەوە بچڕاو دۆلکەکە کەوتە ناو بیرەکەوە (جەریی بوو موجر) واتە ئەو کابرایەی کە پێغەمبەری بەکرێ گرتبوو ، جورئەتی‌کردو لە پێغەمبەری دا ، یا قسەی پێ‌ووت .

(٢٦) هەموو پێغەمبەرێك لەپێش پێغەمبەرێتی‌دا (ئیرهاصاتێکی) بووە ، بـا ئەمەش یەکێك بێ لەئیرهاصاتی پێغەمبەری ئیسلام ، هەر بەوڕەنگە لە شیعری دوایشا .

(٢٧) خۆ سەجدەی دارو : واتە دارو بەرد زۆر جار سەجدەیان بردووە بۆ پێغەمبەر ، وە سەری بەندەگی‌یان بۆ دانەواندووە . نە دارو بەردی تۆ : واتە خۆ تۆ ئەی ئادەمیی دارو بەرد نییت تا تێ‌نەگەیت ، بەڵکو ئادەمی‌یەکی ژیریت ، کە واتە باوەڕ بکە بەم دارو بەردانە .

(٢٨) نەڵێی ئیحیای مەوتا : واتە وانەزانییت کە مردوو زیندووکردنەوە هەر بۆ عیسا بووە ، چونکە پێغەمبەری ئێمەش مردووی زیندوو کردۆتەوە ، وەك دوو کوڕەکانی ئەیوبی ئەنصاری بێ .

(٢٩) غەزوە : واتە ئەوڕۆژەی کە غەزای تیا ئەکرا . غەزائی : ئەوانەی کـە

دڵی تینوو گەرووی ووشکیان تەواو پاراوو تێراو بوو
تەواو ئاوی دڵی دانۆ و خۆش تصدیقو ئیذعانە (٣٠)

نیهالی مەنهەلی ئیمان ظریف سەرسەبزو خورڕەم بوو
گوڵو لالەو وەنەوشەی دیین تەواو خێزا بەم ئاوانە(٣١)

هەڵی گرت ئاوی ساواو بە ناوی زەردهیشتیا رشت
ئەو ئیحیای عەینی ئیعجازەو ، ئەم ئیطفای ناری طغیانە(٣٢)

حەدم کوا من بەیانو عەدی ئیعجازی محمد کەم
کە تەعدادی نجومی ئاسمان خارج لە امکانە (٣٣)

---

غەزایان ئەکردو ئەجەنگیین لەرێی خوادا . بێ غەزا : بێ خواردنێـك کە بەری دڵیان بگرێ . لەتینانا : لە ڕێی هێنانەوەی هێـزو تیـنا . سەحابانە : واتە وەك هەوری بە بارشت ئاوی هەڵڕشت، بەم‌ڕەنگە دەستی پیرۆزی نایە ناو دەفرێکەوە کە تۆزێ ئاوی تیابوو ، ئیتر لـە بـەینی پەنجەکانی‌یەوە ئاو هەڵئەقولاً وەك ئاوی بەهەشت .

(٣٠) ئیذعان : تەصدیقو باوەڕ .

(٣١) نیهال : درەختی ڕاستو جوان . منهل : سەرچاوە . خورەم : ووتەیەکی فارسی‌یە واتە خۆش . خێزا : ووتەیەکی فارسی‌یە واتە خەمڵی .

(٣٢) ساوا : دەریاچەیەکی گەورە بووە لە ناوەندی « هەمەدان » و «قوم»دا ، وەك عبدالباقی زەرقانی ئەڵێ لە شـەرحی : « المواهب اللدنیة ، بالمنح المحمدیة »دا ، کە لە شەوی لەدایك‌بوونی پێغەمبەرا ئەو دەریاچەیە ووشك بووە ، لەپاش ماوەیەکی زۆر شارێك لەو جێگایە دروست‌کراوە، بە ناوی: « ساوا »وە . نار : ووشـەیەکی عەرەبی‌یە واتـە ئاگر . زەردهیشت : لوغەتێك لە زەردەشت ، کە ئەو ئاگرە هەزار ساڵ سووتاوەو گراوە ، وە ئەویش لەوشەوەدا کوژاوەتەوە ، هەروەك لەو شەوەدا ئاوی ساوا کرابێ بەسەر ئەو ئاگرەدا وابووە .

(٣٣) واتە هەروەختێك توانیت ئەسـتێرەی ئاسمان بژمێریت ، ئەو حەلـە ئەشـتوانییت ئیعجازی پێغەمبەر بژمێریت ، خـۆ ناتوانییت ئـەویان بژمێریت ، کەواتە ناتوانییت ئەمیشیان بژمێریت .

## باسی هاوڕێیانی پێغەمبەر بە تێکرایی

وەرە سەر سەیری سیرەت پاکو صوورەت چاکی ئەصحابی
قەدەم فەرمانی هەرچی بن ئەبێتە ئەنبیا خانە (٣٤)

بە وەجهی چلچرای ڕوویان بە شەمعی رووی جەلاگیر بوو
بە نووری ئەنبیا دەتووت عەرەبستان چراخانە (٣٥)

لە کام کەمتر کەسێ ساتێ سەری خاکی بەری پێی بێ
دەزانێ پێی محمد تاجی فەرقی جەمعی ئەدیانە (٣٦)

مەکە ضائع وەك ئەسکەندەر زەڕو زۆرێکی زۆرو هیچ
بە خاکی ووشکی پێیان تەڕ کە لێوت عینی حەیوانە (٣٧)

---

(٣٤) سیرەت : ڕەووشت‌وخوو . صوورەت : سەرو سیما . قەدەم فەرما هەتەد : واتە بچنە هەر شوێنێك ئەبێتە ئەنبیا خانــە ، ئنجا ئەمە بۆچی وایە ؟ لەبەر شعری پاشوو کە ئەڵێ : بە وەجهی چلچرای، ڕوویان هەتەد.

(٣٥) چلچرا : تەنەکەیەکی گردە ، ناوەڕاستەکەی ئاوێنەیەکی تێ‌گیـراوە ، مۆمێك یـا لەمپایەك لە بەردەمی ئـەو ئاوێنانـەدا هەڵئەواسرێ بـە چلچراکەدا ، لە هەر ئاوێنەیەکەوە لەو ئاوێنانە ، عەکســی ، ڕووناکیی مۆمەکە یا لەمپاکە ، دەرئەکەوێ ، وە بە ڕووناکیی هەموولایەکیان ئـەو شوێنەی کە تیا هەلواسراوە رووناکی ئەکەنەوە ، ئنجا لەم شیعرەدا شاعیر تەشبیهی ڕووی هاوڕێکانی پێغەمبەر ئەکات بە چلچرا لەمەدا کە هەموو بەجۆرێ لە چرای ڕوخساری پێغەمبەر ڕووناکی‌یان وەرگرتووە ئەتووت عەرەبستان بە نووری ئەنبیا بۆتە چراخان .

(٣٦) واتە ئەگەر هیچ‌وپووچترینی ئادەمیی ساتێك ســەری خاکی بەری پێی پێغەمبەر بێ، بە ڕەنگێکی وا سەرئەکەوێ لە ژیری‌و بیرو خوا ناسیی‌دا ــ تێ‌ئەگات کە پێی محمد تاجی سەری هەموو ئاینێکە .

(٣٧) ئەسکەندەر : مەبەست ئەسکەندەری مقدونی‌یە ، کە گەورەترین سەرکردە « قائد»یەکی جەنگیی بووە لە جیهانا .

لە سالی ٣٥٦ی پێش میلاد ، لە شاری «بیلا» لە یونان هاتۆتە دنیاوە، لە تەمەنی سیانزە ساڵی‌دا خوێندنی سەرەتایی تەواوکردووە ، وە فیلیبی باوکی ناردوویەتی بۆلای ئەرەستوو کە خوێندنی پێ تەواو بکات .

له خوانی سوحبەتی گەر سارەبانێ لوقمەیەکی خوارد
له علم‌و حکمەتا ئەت‌ووت : ئەمە ئوستادی لوقمانە [٣٨]

ئەگەر کوێستانی‌یێ چاوی بە سورمەی خاکی بەرپێ‌ی رشت
رمالی دەشتی گەرمیانی ، لە بەرچاو بوو بە دوڕدانە [٣٩]

مەجوسیی‌زادەیێ فورسیی ، کە حُبّا بوو بە مستعرب
گەدابوو پادشا دەرچوو ، بەڵێ سەلمان سولەیمانە [٤٠]

---

له تەمەنی بیست ساڵیدا باوکی مرد ، لە ساڵی ٣٣٤ی پێش میلادا هێرشی بردە سەر ئێران ، شای ئێران کە دارا بوو رەوی‌کرد لەبەریا ، ئنجا چووە سەر سووریاو گرتی ، دوای ئەو چووە سەر مصر بە بێ‌بەرگریی ، وە بناغەی شاری اسکندریەی دانا .

له ساڵی ٣٢٧ی پێش میلاد هێرشی بردە سەر هیند بە بێ هیچ بەرگری‌یەك ، تا گەیشتە ڕووباری « هیفاز » لەوێ ویستی تێ‌پەڕێ تا بگاتە ڕووباری « غانج » بەڵام لەشکرەکەی دوای نەکەوتن لە وڵاتێکی بەربەرەللادا کە شارەزای هیچ شوێنێکی نیین ، بە ناچاریی ، ئەویش لەوێدا وێستا ، وە بەم‌ڕەنگە گەورەترین امپراطۆرییەتی لە جیهانا دروست‌کرد .

له ساڵی ٣٢٧ی پێش میلاد نەخۆش‌کەوت ، وە دوای پانزە رۆژ مرد ، پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە ٣٣ ساڵ .

حەیوان : مصدرە بەمانا حەیاتە ، واتە ژیانی بەراستی‌یە .

(٣٨) سارەبان : ووتەیەکی فارسی‌یە واتە حوشترەوانە . لقمان : کوڕی باعوراء ، وە خوشکەزای ئەیوب پێغەمبەرە ، پیاوێکی زاناو دانا بووە ، خوا ئامۆژگاری‌یەکەی بۆ کوڕەکەی پێ جوان بووە ، بۆیە لە قورئانا ئەیگێڕێتەوە .

(٣٩) کوێستانی‌یەك : ئەگونجێ مەبەستی لەم کوێستانی‌یە ، سەلمانی فارسی بێ کە ناوی لە شعری دوایی‌دا دێ ، وە یەکەمین ئێرانی‌یەکە کە مسلمان بووە ، وە چاوی بە سورمەی خاکی بەری پێ‌ی پێغەمبەر ڕشتووە ، بۆیە دڵی چوو بە عەرەبستانا ، وە تا مرد بەجێ‌ی‌نەهێشت .

(٤٠) مەجووسی : ئاگرپەرست . فورسیی : فارسیی . مستعرب : غەیرە عەرەبی‌یەکە کە فێری عەرەبی بووبێ ، وە لە وڵاتی عەرەبستان دانیشتبێ ، وەك سەلمانی فارسیی‌و بلالی حەبەشیی‌و صهیبی رۆمیی ، کە سێ

## بأسی ئەبووبەگری صدیق

خوصوص ئەو صدق کردارە ، دەروون گەنجینەی ئەسرارە
کە ثانی اثنین فی الغارە ، کە (شیخُ الصَّحبی) هەموانە(٤١)
بەوی فەرمو خودا رازییم لەو ، ئەر رازیی لە من بێ ئەو
تەجەللی خستیە چەرخە ، وەکوو ئەم چەرخی گەردانە (٤٢)

---

صحابەی پێغەمبەر بوون ، وە بە عەشقی پێغەمبەرەوە ، دەستیان لە ولاتو لە دینو لە زبانی خۆیان هەلگرت ، وە لە خزمەت پێغەمبەرا مانەوە تا مردن . سەلمان سولەیمانە : واتە سەلمانی فارسیی کە ئاگرپەرستێکی بێناوو نیشان بوو ، لە سایی ئیسلامەتی‌یەوە بوو بە پیاوێکی وەك حەزرەتی سولەیمان لە دینو دنیادا .

(٤١) صدق کردار : واتە هەموو کردەوەیەکی لە ڕووی پاکیو ڕاستی‌یەوە بووە . ثانی اثنین : واتە دووهەمی دووکەس ، بەمە ئاماژە «ئیشارة» ئەکات بۆ هاوڕێیی ئەبووبەکر بۆ پێغەمبەر ، لە غاری «ثەور»دا ، کاتێك کە کۆچیان‌کرد لە مەککەوە بۆ مدینە ، وە خۆیان شاردەوە لەو غارەدا ، شیخ الصحب : واتە گەورەی هەموو صحابەکان .

(٤٢) بەوی فەرموو : ئاماژەیە بۆ قسەیەك کە عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ئەیگێڕێتەوە ئەفەرموێ : چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ، ڕوانیم وا ئەبووبکر لە خزمەتیا دانیشتووە ، عەبایەکی لەخۆیەوە پێچاوە ، وە بەرۆکی عەباکەی بە توولێکی درەخت قایم کردووە تا سنگی دەرنەکەوێ ، لەودەمەدا جبریل هاتە خوارەوە بۆ خزمەت پێغەمبەرو لێی‌پرسی : بۆچی وا ئەبووبەکر خۆی پێچاوەتەوە بەم عەبایەو ، یەخەکەشی دروە بە توول ، پێغەمبەر فەرمووی چونکە هەرچێکی بوو هەمووی لە منو لە ئیسلامەتی‌دا بەخت‌کردووە ، هیچی نەماوە ئەم تاقە عەبایە نەبێ کە خۆی پێ داپۆشیوە ، جبریلیش فەرمووی : پێی بلێ : خوا سەلامت لێ ئەکات ، ئەفەرموێ : ئایا لەم کاتی نادارایی‌یەدا لە من ڕازی‌یە ؟! پێغەمبەر کە سەلامەکەی خواو قسەکەی پێ‌گەیاند ، ئەبووبەکر لە خۆشیانا دەست‌ئەکات بە گریان ، وە بە دەوری خۆیا ئەسووڕێتەوەو سێ جار لەسەر یەك ئەفەرموێ : خوایە من لە تۆ ڕازییم .

حەدیثە گەر خەلیلێکم بە غەیرەز رەب بگرتایە
ئەبووبەکرم ئەگرت ، الحق خیرەد لەم روتبە حەیرانە (٤٣)

جیرانێکی شکاتی کرد لە خزمەت فەخری عالەمدا
کە بۆنی گۆشتی برژاو دێ هەمووشەو لەم دەرو بانە (٤٤)

لە خانەی حەزرەتی صدیقەوە دێ غالیبا ئەم بۆ
دراوسێی بێبەشیین ئێمە ئەمە کەی دەأبی جیرانە (٤٥)

کە فەخر المرسلین بۆی وەردی صەدری پاکی کرد فەرمووی
ئەمە بۆی خشیةاللەیە ، ئەمە بۆی قەلبی بریانە (٤٦)

مەگەر نەدبیستووە ئەم قەولە فەرمووی موخبری صادق
شەوی ئیسرا ئەبووبەکرم ئەدیی لەم ئاسمانانە (٤٧)

---

(٤٣) گەر : کورتەی ئەگەرە . خەلیل : دۆستێکە لە تەنگانەدا بەتەمای بییت کە بێ بەدەنگتەوەو پشتگیریت بکات ، واتە لەدوای خوا ئەگەر من دۆستێکیترم بگرتایە بۆ ڕۆژی تەنگانە ، ئەبووبەکرم ئەگرت ، بەلام من بە غەیری خوا کەسیتر ناگرم بە پشتیوان . خیرەد : ژیریی ، واتە ژیریی‌و بیر لەم پایە بەرزەی ئەبووبەکرە سەرسامە .

(٤٤) جیران : ووتەیەکی عەرەبییە بەمانا دراوسێیە .

(٤٥) ئەمە کەی دابی جیرانە : واتە ئەمە کەی ئادابی دراوسێتییە ؟!

(٤٦) وەرد : ووشەیەکی عەرەبییە واتە گوڵە . صدر : عەرەبییە بەمانا سنگە ، واتە پێغەمبەر کە بۆنی گوڵی سەرسنگی ئەبووبەکری کرد فەرمووی : ئەم بۆنە بۆنی دڵ‌و دەروونی ئەبووبەکرە کە لە ترسی خوا ئەبرژێ‌و هەڵئەقرچێ ، وە ئەم خەڵقە بە بۆنی گوشتی ئەزانن .

(٤٧) موخبری صادق : پێغەمبەرە کە هەر خەبەرێك ئەو بیدا ، ڕاست‌و دروستە ، وە جێی گومان نییە . شەوی ئیسرا هەتەد : وا دەرئەکەوێ لەم فەرموودەی پێغەمبەرەوە کە خوا وێنەی ئەبووبەکری لە هەموو ئاسمانەکانا نیشانی پێغەمبەر داوە بۆئەوەی نەترسێ‌و پێی دابێ ، وەك لە شعری دواییەوە دەرئەکەوێ .

ئەنیسی بو و لە هەر رێیی ، جەلیسی بوو لە هەر جێیی
مەسەلیان فی‌المەسەل بیلێم ئەم ئاصف ئەو سلیمانە (٤٨)

عروقی شەكو شوبهەی ئەهلی شیعەو رەفضی پێیەی بوو
ئەگەر ئینصاف بێ لایان بەشییری ئەم دەلیلانە (٤٩)

کەسێ صدیقی ئەکبەر بێ ، مەهین یاری پەیەمبەر بێ
ئەبێ پێی ئەفسەری سەر بێ ، لەکن داناو فەرزانە (٥٠)

## باسی عومەر

بە ئانی و ئەوەلە فەرقی ئەبووبەکرو عومەر ئارێ
دین ئینسانە لەچاویا ، ئەم دو ئینسانە دو ئینسانە (٥١)

---

(٤٨) ئەنیس : ووتەیەکی عەرەبی‌یە ، بە هاورێیەك ئەڵێن کە بە بینینی کەیفخۆش ببیت . جەلیس : هاودەم لە کۆڕی دانیشتنا . ئاصف : کوڕی بەرخییا ، وە وەزیرو خۆشەویستی حەزرەتی سلیمان بووە . سلیمان : کوڕی داوود پێغەمبەرە ، کە پاشایەکی زۆر بەدەسەڵات بووە ، ئەم پاشایە بیت المقدسی دروستکردووە ، وە (٩٢٩) ساڵ پێش میلاد کۆچی دوایی کردووە .

(٤٩) عروق : جمعی «عرق»ە ، بەمەعنا رەگەو ڕیشەیە . شەك : بە مانا گومان و دوودڵی‌یە لە شتێکا . شوبهە : بەمانا لێ‌گۆڕانی شتێك . رفض : بەمانا رافضی‌یە ، کە جۆرێکن لە شیعە ، واتە ڕیشەی گومان و سەرلێ‌شێوانی شیعەو رافضی‌یەی بوو بە بەڵگەی ئەم دەلیلانە کە لە شییری بڕندە تییژترو بڕندەترن .

(٥٠) مەهین : ووتەیەکی فارسی‌یە بەمانا گەورە . پەیەمبەر : پێغەمبەر . ئەفسەر : فارسی‌یە بەمانا تاجە . فەرزانە : فارسی‌یە بەمانا ژیرە . واتە یەکێك گەورەترین ڕاستگۆ بێ لە جیهانا ، وە گەورەترین هاوڕێ و هاودەمی پێغەمبەر بێ ، ئەبێ پێی تاجی سەری هەموو کەسێك بێ بە خوێندەوارو نەخوێندەوارو شێتاو ژیرەوە .

(٥١) ئارێ : بەڵێ . دین ئینسانە : واتە وەك ئینسانێك وایە . ئەم دو ئینسانە: کە ئەبووبەکرو عومەرن . دو ئینسانە : واتە دوو بیبیلەیە لە چاوی دینا ، واتە ئەبووبەکرو عومەر بیبیلەی چاوی دینی ئیسلامن .

که غڕەی صبحی صمصامی لەتێو شامی نیام دەرکەوت
منوگر بوو شەوی کفری یەمەن تا شام صبحانه (٥٢)

بە دوو دۆشییزە دوختەر مەددو جەزری نییل دەبوو هەر ساڵ
بە فەرمان تەرکی کرد ، ئەو تا قیامەت بەندە فەرمانه (٥٣)

لە بەینی ئەو هەتا قەیسەر مەسافەی قەسر زیاتر بوو
بە یەك پەنجە سەری هەڵدا ببین ئەم دەستو پەنجانه (٥٤)

---

(٥٢) غرە : سپێتی‌یەکە لە ناوچەوانی ئەسپا . صمصام : شمشێری برنـــدە . نیام : ووتەیەکی فارسی‌یە واتە کێلان . صبحانه : واتە وەك صبح . واتە کە رووناکیی بەری بەیانی شمشێری عومەر دەرکەوت لەناو شاری شاما ـ کە وەك کێلان وابوو بۆ بێ‌بڕوایی ـ رووناك بووەوە شەوی بێ‌بڕوایی لە یەمەنەوە تا شام .

(٥٣) ئەگێڕنەوە کاتێك کە عەمری کوڕی عــاص مصری گرت ، ئەهــالی مصر پێ‌یان‌ووت : لە زۆر کۆنەوە ئەبێ هەموو ساڵێك دوو کچی جوانی ســەر بە مۆر بڕازێنینەوەو بیخەینە ناو ئاوی نیبلەوە تا سەرڕێژ « فیضــان » بکات ، وە بیتو بڕوات ، عەمر ئەمەی نووسی بۆ حــەزرەتی عومــەر ، ئەویش کاغەزێکی نووسی بۆ نییل ، پێ‌ی‌ووت : « لە عومــەری کــوڕی خەتتابەوە بۆ نییلی مصر ، ئەگەر تائێستا بە ئارەزووی خۆت هاتوچۆت کردووە ، ئێمە هیچ پێویستیی‌یەکمان بە تۆ نی‌یە ، وە ئەگەر بە فەرمانی خواش هاتوویتو چوویت بڕۆ بە ناوی خواوە » کاغەزەکەی نارد بــۆ والی مصر کە بیخاتە ناو نییلەوە ، لەوڕۆژەوە ئەو دەستوورە کۆنە نەما ، وە نییل بە بێ‌گیروگرفت هاتوچۆی خۆی ئەکات . ئنجــا ئــەم شــعرە ئاماژەیە بۆ ئەم داستانە . دۆشییزە دوختەر : واتە دوو کچی سەر بــە مۆر ، کە هەموو ساڵێك خراونەتە ناو نییلــەوە تــا ئــاوەکەی ئەهــاتو ئەکشایەوە « مدو جزر » .

(٥٤) قەیسەر : بە پاشای رووم ووتراوە کە لەکاتی عومەرا «هرقل» بــووە ، مەسافەی قەسر : چل‌و هەشت میلە کە لە بڕینی ئەم ماوەیەدا دروستە بۆ رەوتەنیی «مسافر» نوێژی چوار رکاتی کورت بکاتەوە بە دوو رکات . بە یەك پەنجە : زۆر گەڕام ئەم قسەیەم لە هیچ کتێبێکا نەدۆزی‌یەوە ، نازانم مەلا خاکی ئەمەی لەکوێ هێناوە .

نه تەنها رەونەقی بازاری کوففاری شکاندو بەس
فیرار کردەی دەسی مەعنی ئەو ئاخر دێوو شەیتانە (٥٥)

بە زەیتی حکمەت و حوکمی ئەو ، ئەم مِصباحە ، صبح ئاسا
هەتا هات شوعلەوەرتر بوو ، کە بوو بەم ڕۆژی رەخشانە (٥٦)

بە ئابی تیغی عەدلی ئەو نیهالی دین سەمەروەر بوو
بەری فەیرۆزەوو گەوهەر ، دوڕو ، یاقووتو ، مەرجانە (٥٧)

(صَدای یا ساریە)و ( شُرْبی ) پیاڵەی زەهرەکەی قەیسەر
لەگوێتە یادتە یەکیەك چ‌پەیداوو نمایانە (٥٨)

---

(٥٥) واتە حەزرەتی عومەر وەنەبێ هەر بازاری بێ‌بڕوایی‌و بێ‌بڕوایانی شکاندبێ‌و هیچی‌تر ، بەڵکو شەیتان لە دەستی ئەو رەوی کردووە .

(٥٦) واتە بە ڕۆن زەیتی حکمەتو حوکمی عومەر ، چرای ئیسلامەتی وەك بەری بەیان هەتا هات رووناکتر بوو ، تا بوو بەم ڕۆژی نیوەڕۆیە .

(٥٧) واتە بە ئاوی شمشێری دادو عەدالەتی عومەر ، درەختی دیین بەردار بوو بە بەری پیرۆزەو گەوهەرو مرواریی‌و یاقووت‌و مەرجان .

(٥٨) صدای یا ساریە : ابن حجر لە کتێبی «صواعق»و زۆر لە زانایانی ئیسلام، هەریەکە لە کتێبی خۆیا ئەگێڕێتەوە ئەڵێ : حەزرەتی عومەر لەشکرێکی بە سەرکردەیی « ساریە » نارد بۆ ئێران ، ڕۆژێکی هەینی ئەم لەشکرە لە «نەهاوەند» لە نزیك شاخێکەوە ئەکەونە جەنگەوە ، لەشکری ئێران ئەیانەوێ دەوریان بگرن ، لەوکاتەدا عومەر لە مەدینە دوانی هەینی ئەخوێنێتەوە ، وە لە ناوڕاستی دوانەکەدا ، دەست لە دوانەکەی هەڵئەگرێ ، وە دوو جار ، یا سێ جار بانگی ساریە ئەکات‌و ئەڵێ : «یا ساریة الجبل» واتە ئەی ساریەڕووبکەرە شاخەکە ، دوای ئەوە دەست‌ئەکاتەوە بەدوانەکەی ، دانیشتووانی جمعەکە هەموو تەماشای یەك ئەکەن ، امامی علی ئەفەرموێ سەبرکەن تا لە جمعەکە ئەبێتەوە ، دوای جمعەکە پرسیاری لێ‌ئەکەن ، ئەفەرموێ : لەوکاتەدا بەدڵما هات کە لەشکری بێ‌بڕوایان لە ئێران خەریکن دەوری لەشکرەکەی ئێمە بگرن، وە ئەمان نزیکن لە شاخێکەوە ، ئنجا ئەگەر پاڵبدەن بەشاخەکەوە پشتیان قایم ئەبێ ، وە هەر ڕووبەڕوو جەنگیان لەگەڵ ئەکەن ، بەلام ئەگەر ڕوونەکەنە شاخەکە لە هەر چوار لاوە دەوور ئەدرێن ، ئیتر بە بێ‌پەروا

له اطفای نارو دەفعی زەلزەلەی ئەو چاك نظر فەرموو
لەمن تفصیلی بۆت نادەم ، بچۆ خۆت نەزهە بڕوانە (٥٩)

## باسی عوسمان

برا ئیتر بەچۆکا بێ لەسەر ئەژنۆی ئەدەب دانیش
تەواو چاو ببڕە بەرپێی خۆت کە ئێکە بەحسی عوسمانە

سوئالی ڕێی حەق‌و تەفسیرو علم‌و حلم لەو پرسە
کە ئەو ڕوشتەی نظامی سوورەت‌و ئایەتی قورئانە (٦٠)

ئەوە زینەت فزای ڕوی شاهدی قورئان‌و حوسن‌ئارا
بەڵێ جمعیتی طوڕە بە بێ‌شانە پەرێشانە (٦١)

---

ئەو قسەیەم لە دەم دەرچوو . لەدوای مانگێك تەتەر « قاصد »ی ساریە گەیشتە مەدینە بە کاغەزی ساری‌یەوە ، ئەڵێ : ئێمە مانگێك لەمەپێش لە ڕۆژی هەینی دا کەوتینە جەنگەوە ، لەوکاتەدا گوێمان لە دەنگێك بوو دووسێ جار پێ‌ی‌ووتین : «یا ساریة الجبل» ئێمەش پاڵمان دا بەشاخەکەوە ، وە جەنگەکەمان بردەوە . شربی پیاڵەی زەهرەکەی قەیسەر : زۆر گەرام ئەم قسەیەشم نەدۆزی‌یەوە ، نازانم خاکی ئەمەی لەکوێ هێناوە .

(٥٩) واتە باش وورد بەرەوە لەو هەموو جەنگانەی کە عومەر کردوونی‌و بردوونی‌یەوە ، وە ئەو هەموو ڕووداوانەی کە لەکاتی ئەوا قەوماوەو کووژاندونی‌یەوە . نەزهە : کتێبی نزهة المجالسە .

(٦٠) ڕوشتە : بە کشتەکێك ئەڵێن کە تەزبیح‌و ملوانکەی پێ هۆنرابێتەوە ئنجا لەبەرئەوەی کە عوسمان سوورەتەکانی قورئانی ریزکردووەو چوار نسخەی لێ نووسیوەتەوەو بڵاوی کردوونەتەوە بە چوار قوڕنەی جیهانی ئەوڕۆژەی مسڵمانانا ، بۆیە بە عوسمان ئەڵێ : ڕوشتەی نظامی سوورەت‌و ئایەتی قورئانە .

(٦١) دوای کۆچی دوایی عومەرو بڵاوبوونەوەی مسڵمانان بە هەموو عەرەبستان‌و مصرو عراق‌و ئێران‌و شام‌و فەلەستینا ، وە دوای دانانی

عەدوو پەردەی دڵی کە دڕیی ، لەشەرما چاوی هەڵنەبڕیی
بە جان نەقدی حەیای دەکڕیی ، ئەمانە دەأبی عوسمانە (٦٢)

هەڵیکرد سەرسەری فیتنە ، تەپو تۆزی بەڵای هەستان
عورووسیی باڵەخانەی چاو ، بە تۆز بوو بە بەڵاخانە (٦٣)

---

عوسمان بە خەلیفە لەجێی عومەر ، بە ماوەیەك خەبەر بە عوسمان گەیشت کە قورئان خوێن لە خوێندنەوەی هێندێ ووتەی قورئانا دووبەرەکی کەوتوون ، واتە هەریەکەی بەرەنگێك ئەیخوێنێتەوە ، خێرا عوسمان ناردی ئەو دەفتەرەی کە قورئانی تیا نوسرابووەوە لەکاتی ئەبووبەکرو عومەرا ، وە لای حەفصەی خێزانی پێغەمبەر دانرابوو ، هێنای ، وە گەورەکان لە هاوڕێکانی پێغەمبەری کۆکردەوە ، وە ئایەت بە ئایەت ئەیان‌خوێندەوە ، وە دڵنیا ئەبوون لە خوێندنەوەکەی وە دەربڕیین «تلفظ»ەکەیو ، جێگاکەی لەناو سوورەتەکەداو جێگای لەناو قورئانەکە دا تا سی جزمەکەیان تەواو کرد ، وە هەموو سوورەتەکانیان ریزکرد ، ئنجا چوار نوسخەی لێ گرتەوەو ناردی بۆ مەککەو کوفەو بصرەو شام . فزا : بەمانا زۆر . طورە : مووی پێشانی ، واتە عوسمان ئارایشی قورئانی دا بە ریزکردنی سوورەتەکانیو بەرودوا هاتنیان بەدوای یەکا بە ڕێك‌وپێکی . هەموو شتێك کە زۆر بوو ، وە کەوتن بەسەریەکا ناشرین دەرئەکەوێ ، بەڵام کە ڕیزکرانو ڕێك‌خران ئنجا جوانی‌یەکەی دەرئەکەوێ ، وەك مووی پێشانی تا بەناو یەکا بچێو ئاڵۆزکابێ ناشیرین دەرئەکەوێ ، بەڵام کە شانە کراو تاوەکانی لە یەك جیابوونەوە ئنجا جوانی‌یەکەی دەرئەکەوێ ، وەکوو ئەڵێ : بەلێ جمعیتی طورە بە بێ‌شانە پەرێشانە .

(٦٢) عەدوو : ووتەیەکی عەرەبی‌یە بەمانا دوشمن .

(٦٣) سەرسەر : بای سەخت‌و توند . عورووسیی : ژوورێکە کە پێشەکەی هەموو یەك پەنجەرەی تاك بێ ، بەجۆرێك کە بکرێتەوە ، وە هاتوچۆی پیا بکرێ ، ئنجا عورووسیی‌وا هەیە لە نهۆمی یەکەمایە ، وە عورووسیی وا هەیە باڵەخانەیەو لە نهۆمی دووهەم یا سێهەمایە ، چاو کە بە کەللەی سەرەوەیە ، وە لە ژوور هەموو ئەندامێکەوەیە تەشبیە کراوە بە عورووسیی باڵەخانە ، ئنجا ئەم باڵەخانەیە بە تەپو تۆزی بەڵاو ئاژاوە بوو بە بەڵاخانە .

کزەی بارەش ، نە بارەش ، بەڵکو بای شەڕ ، گەردەلوولی کرد
گەرووگیری زبانەی شەمعی دین بوو ، کاینی عەففانە (٦٤)

مینای بیینای بیینائی کە رۆشن بوو دڵگوشای دڵ بوو
بە دوودی دوا هەناسەی شەم ، سیاهیی گرت زەنگیانە (٦٥)

بصر پەردەی بەسەردا چوو ، خەموش بوو شەمعی ذی‌النورین
بە ئومیدی سەحەر من بعد ابێ روبکەینە دەرگانە (٦٦)

لە داغی فیرقەتی شمع هێندە گریاووم نەما چاووم
بە حاڵم فەتحی بابێ کا مەر ئەو بینایی چاوانە (٦٧)

---

(٦٤) گەردەلوول : گێژەڵووکەیەکە کە گێژ بخواو لوول بخواو سەرەوژوور بڕوا ، ئنجا بای شەڕو بەدبەختیی ئیسلامەتی هاتوکردی بە گەردەلوول‌و کردی بە قورگی عوسمانی کوڕی عەففانا تا زبانەی شەمعی دینی کووژانەوە .

(٦٥) مینا : شووشەی ڕووناك . بیینایی : بینیین ، ئەبێژرێ : بینایم نی‌یە ، واتە نابینم . بیینائی : ئەوەی کە پێی ئەبینییت کە چاوە . شەم : بصر کورتەی شەمعە . زەنگیانە : واتە وەك زەنگیی ، واتە شووشەی بیینایی چاوی عوسمان کە ڕۆشن‌و ڕووناك‌و دڵگوشا بوو ، بە دووکەڵی دواهەناسەی شەمع کە کوژایەوە ، ئەو شووشەیە ڕەش هەڵگیرسا وەك زەنگیی .

(٦٦) بصر : چاوە . شەمعی ذی‌النورین : بە عوسمان ئەڵێن چونکە دوو کچی پێغەمبەری بەرودوا مارە کردووە ، یەکەم أم‌کلثوم ، دووهەم رقیە ، واتە عوسمان کە چاوی لێکنا بە ئێجکاریی ، چرای کوژایەوە ، چرا کە نەما ئەبێ بە ئومێدی ڕووناکیی بەری بەیان ڕووبکەینە دەرگانە ، کە بریتی‌یە لە امامی علی ، چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی : « انا مدینة العلم و علی بابها » واتە من شاری زانینم‌و علی دەرگاکەیەتی .

(٦٧) شەمع : مۆمە کە بریتی‌یە لە عوسمان . مەر : کورتەی مەگەرە . بینایی چاوان : بریتی‌یە لە خوا ، واتە بە مردنی عوسمان ئەوەندە گریام تا چاوەکانم کوێر بوون ، ئنجا مەگەر خوا دەرگایەکی ڕووناکیم لێ بکاتەوە .

# باسی علی

بلێ تا ڕێوی طبعانی نفاق ئەندیشی ئەم صحرا
کەنارە گیر بن ئیبتر تۆبە تۆبەی شێری مەیدانە [٦٨]

بە کامین زۆرو زاتێ ، کەس بەیانی زۆرو زاتی کا
کە وەك قلب الاسد قەلبی ئەسەد لەم شێرە لەرزانە [٦٩]

شەوی هجرەت لە مەککە ئەحمەدو صدیق کە دەربازبوون
لە جێگەی ئەحمدا حەیدەر بە شیرۆ نوست شێرانە [٧٠]

عەدوو ، وەختێ علی‌یان دیی لەجێی ئەحمەد ، لە جێ مات‌بوون
لە هەرکوێ دەرکەوێ گوێی شێر ، بەڵێ ڕێویی هەراسانە

خۆ ناوێرم بڵێم دەستی علی‌و دەستی خودا یەکبوون
ئەترسم پێم‌بڵێن : شیعەی علی ئەم کۆنە سونیانە

قسەی قەلعی دەری خەیبەر بەدەست ئەو حەیدەرە ــ ناکەم
بە دڵدا یادی ئەو بەحسە ئەگەر بێ دێتە جۆلانە [٧١]

---

(٦٨) واتــە بڵێ تــا ترسنۆکان‌و ئەوانــەی کە بەبــیر ناپاکن خۆیان بشارنەوە ، چونکە نۆبە نۆبەی امامی علی‌یە کە شێری مەیدانە .

(٦٩) بە کامــین : بەکام . قلب الاســد : نازنــاوی «رتشــارد»ی پاشــای ئینگلیزە کە لە جەنگی سەلیبی‌دا جەنگییوە لەگەڵ سەلاحەالدینا ، وە پڕبەدڵ لە سەلاحەالدین ترساوە . واتە بە کام زۆرو زاتێکەوە ، یەکێك بتوانێ بــاسی زۆرو زاتی امــامی علی بــکات ؟ ئەو امــامی علی‌یــەی کە دڵی شێر لەبەریا لەرزیوە ، وەك لەرزینی دڵی ریشارد لە بەرانبەری سەلاحەالدینا .

(٧٠) واتە ئەو شەوەی کە بێ‌بڕواکانی مەککە بڕیــاری کوشتنی پێغەمبەر ، وە بە شیبری ڕووتەوە دەوری مالیاندا ، پێغەمبەرو ئەبووبەکریش بڕیاریاندا کە ئەوشەوە لە شاری مەککە دەرچن ، وە کۆچ‌بکەن بۆ مدینە ، امامی علی ئەوشەوە لە جێگاکەی پێغەمبەرا نوست تا بەیانی .

(٧١) لە سالی ٦٢٨م دوای صلحی حدیبیە بە پانزە ڕۆژ پێغەمبەر چووە سەر

خەلاتی (لا فتی) ئەم شان ، خەلاتی (هل اتی) ئەو شان
نیشانی شانی شان بە ئەو شانە ، بە ئەم شانە(۷۲)

---

«خیبر» کە قایمترین شوێن ، وە زۆر قەڵای گەورەی تیابوو ، یەکەمجار ئەبووبەکری نارد بۆسەر یەکێك لە قەڵاکانی کە بیگرێ ، بەلام بۆی نەگیراو گەڕایەوە ، لەپاشا عومەری نارد ئەویش گەڕایەوە ، ئنجا امامی علی نارد بە بەیاخێکەوە ، وە پێی فەرموو برۆ تا خوا قەلاکەت بۆ ئەکاتەوە ، کە امام نزیككەوتەوە جەنگ کەرانی ناو قەلاکە بۆی هاتنە دەرەوە ، وە دەستکرا بە جەنگ ، جوولەکەیەك شیرێکی داوەشان بۆ امام قەلغانەکەی لە دەست پەڕیی ، امام دەروازەی قەلاکەی دەرهێناو کردیی بە قەلغان بۆ خۆی ، ئەو دەروازەیەی دانەنا ، وە بە دەستی ڕاستی جەنگی ئەکرد تا سەرکردەی قەلاکە کوژرا ، وە قەلاکەی بۆ کرایەوە ، ئنجا دەروازەکەی کرد بە پردو مسلمانەکان بەسەریا ئەپەڕینەوە بۆ ناو قەلاکە، هەر بەوڕەنگە تا هەموو قەلاکان گیران . واتە باسی هەلکەندنی دەرگای خەیبەر بەدەستی امامی علی ناکەم ، چونکە بە باسەکەی مەردوم دێتە لەرزە .

(۷۲) لا فتی : ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر لە تەعریفی امامی علی‌و شیرەکەیدا کە ناوی ذوالفقار بووە فەرموویەتی : «لا فتی الا علی ، لا سیف الا ذوالفقار» واتە جوامێر هەر علی‌یە ، شیر هەر ذوالفقارە ، کە ئەو شیرە وەك خەنجەر لە ناوەڕاستا دووخێکی ئەستووری بووە ، وە دەمی شیرەکەی زۆر پان‌و ئەستوورو درێژ بووە، وە کەم کەس توانیوێتی هەلی‌سووڕێنی‌و بیوەشێنێ . هل اتی : ئەگێڕنەوە کە (حسن)و (حسین)ی کوڕانی امامی علی نەخۆش‌ئەکەوون ، پێغەمبەر لەگەل چەند هاوڕێیەکیا ئەچێ بۆ ئەحوال‌پرسینیان ، هاوڕێکانی پێغەمبەر بە امامی علی ئەلێن : خێرێکیان بۆ بڕیار بدەن ، بەلکو خوا تەندروستی‌یان بۆ بنێرێ ، امامیش لەگەل حەزرەتی فاطمەی ژنی‌و کارەکەرەکەیانا ڕۆژووی سێ ڕۆژ لەسەر خۆیان نەزر ئەکەن ، بەیانی بە ڕۆژوو ئەبن ، وە امام حۆقەیەك جۆ قەرز ئەکات بۆ ئێوارێ کە پێنج کولێرەی لێ بکەن ، هەریەکەی بۆ یەکێکیان ، وە ڕۆژۆکەی پێ‌بشکێنن ، ئێوارێ کولێرەکان دائەنێن ، لەوحەلەدا کە دەستی بۆ ئەبەن هەژارێك لە بەرقاپی‌یەوە داوای خواردنێکیان لێ ئەکات ، ئەوانیش کولێرەکانی بۆ ئەنێرن، وە خۆیان بە ئاو ڕۆژووەکەیان ئەشکێنن، سبەینێ بەڕۆژوو ئەبن بە بێ‌پارشێو ، ئێوارێ پێنج کولێرەی‌تر دائەنێن، دووبارە لەپێش دەست بۆ بردنیا هەتیوێك لە بەرقاپی‌یەوە داوای شتێك ئەکات ، ئەوانیش کولێرەکانی بۆ ئەنێرن ، لە ئێوارەی سێهەمدا دیلێك

فدات بم ناقه سواری ابن عمی أحمدی مختار
که بێ تۆ خانه وێرانه نەك ئێرانه چ ئێرانه(٧٣)

علی ئینسانی عەینەینه ، علی بابی حەسەنەینه
علی بابی مدینەی علمه نەك هەر بابی ئەم دوانه (٧٤)

أسدُ الله الغالبْ علیْ ابن أبی طالبْ
عەزیز نالێم وەکو جانه ، دڵی جانِ الفیِ تێو جانه (٧٥)

---

دێ ، وەك جاران کولێرەکانی بۆ ئەنێرن ، وە بەوجۆرە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبن بە بێ ئیفتارو پارشێو ، ئنجا بە سرووش ئەم ئایەتانە دێنە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ، وە پیرۆزبایی لێ ئەکرێ لەلایەن فریشتەی سرووشـەوە لەسەر باشی کەس‌وکارو ئەهل‌و بەیتی ئەفەرموێ : «یوفـون بالـنذر ، ویخافون یوما کان شره مستطیرا ، ویطعمون الطعام ــ علی حبه ــ مسکینا ویتیما واسیرا ...» واتە ئەوی بڕیاری بدەن (لە چاکە) ئەیکەن ، وە لـە ڕۆژێك ئەترسن (وەك ڕۆژی دوایی بێ) کە بەدیی‌و سەختی‌یەکەی هەموو خراپێك ئەگرێتەوە ، وە خواردەمەنی دەرخواردیی هەژاران‌و هەتیوان‌و دیلان ئەدەن ، با خۆشیان حەزی لێ بکەن . نیشان : شتێکی جوانـە هێندێ پیاوی سەربازی دەوڵەتیی لە خۆی ئەدات بۆ دەرکەوتنی پـایەی سەربازێتیی . شان : ووتەیەکی عەرەبی‌یە بەمانا پایەیە . شان : ئێسقانی ڕاست‌و چەپی خوار مل کە هەر دوو قۆڵی پێوە بەندە . شا : گەورەی دەوڵەتێکە کە نەگۆڕڕێ ، وە لەدوای خۆی کوڕی لەجێی دابنیشێ .

(٧٣) ناقه : حوشتر . ابن عمی أحمدی مختار : واتە ئـامۆزای پێغەمـبەر . ئێرانە : ئەو شوێنەیە کە تۆی تیا بییت ، واتە بە بێ تۆ هەر ئێرە وێران نی‌یە ، بەڵکو خاکی ئێرانیش هەر وێرانە .

(٧٤) ئینسان : بیبیلەی چاو ، واتە علی بیبیلەی هەردوو چاوە . حسـەینەین : حەزرەتی حەسەن‌و حسەین . بابی مدینەی علمه : لەپێشـەوە ووتمـان کە پێغەمبەر دەربارەی امامی علی فەرموویەتی : «انا مدینة العلم و علی بابها» واتە من شاری زانیین‌و علی دەرگای ئەو شارەیە .

(٧٥) واتە ئەی ئازیز ناڵێم علی خۆشەویستە وەك گیان ، بەڵکو دڵی گیـان‌و ئەلفی ناوڕاستی گیانـە .

نی‌یە شمشێرو شیر الا علی‌و ذوالفقاری بەس
عەجەب لەم شییری بەڕانە ، زهی لەم شێری غەڕانە (٧٦)

نی هەر شێری شەهی شێرو نی هەر شمشێری شاهی شییر
چ‌شییرێ ذوالفقار ئاخر ، چ شێرێ شێری غەڕانە (٧٧)

علی‌یە حوبی عنوانی صحیفەو نامەی ئیمانە
بە تەحریمی بلێ خاکی ، بە تەعریضات‌و ئیمانە (٧٨)

(صدف) بۆ (صڵبی) حیدەر نەسلی أحمد دانەیی گەوهەر
دو دوڕەی فاطمەو حیدەر یەکی یەك دوڕی یەکدانە (٧٩)

## پاڕانەوە

مەرێژە ئابڕووم یارەب بە ئابی رووی بنی زەهرا
من ئەرچی ئابڕووی خۆم ڕشت لە بۆ یەك نان‌و دوو نانە (٨٠)

---

(٧٦) بەڕان : ووتەیەکی فارسی‌یە ، بەمانا زۆر بڕندە . زهی : فارسی‌یە بەمانا خۆش . غەڕان : شێرو دڕندەیەکە کە ڕقی هەستابێ‌و بنرکێنێ .

(٧٧) یەزدان : خوای گەورە ، واتە ئەم شێرە ــ کە امامی علی‌یە ــ وەنەبێ هەر شای شێران بێ ، وە ئەم شمشێرە ــ کە ذوالفقارە ــ هەر شای شییران بێ ، چ‌شییرێ ئەبێ بە ذوالفقارو چ‌شێرێ ئەبێ بە شێری یەزدان .

(٧٨) عنوان : سەرباس . صحیفە : پەڕەی نامە . تصریح : ووتنی شت بە بێ‌پەردە . تەعریض : ووتنی شت لەلاوە . ئیما : ووتنی شت لە ژێر پەردەوە . نە : واتە بە تەعریض مەیلێ .

(٧٩) صەدەف : پۆرکی لوءلوءو مرواریی . صڵب : پشت . نەسل : نەوە ، واتە نەوەی پێغەمبەر ــ کە حەزرەتی فاطمەیە ــ بوو بە پۆرگ بۆ ئەو دڵۆپە ئاوەی کە لەپشتی امامی علی‌دا بوو ، کە وەك دانەی گەوهەر وابوو ، ئنجا گەوهەری فاطمەو حیدەر هەرجارێکیان بوو بە دوڕێکی یەك دانە کە حەزرەتی حەسەن‌و حسەینە .

(٨٠) واتە خوایە بەحورمەتی ئابڕووی کوڕانی فاطمەی زەهرا ئاگاداریم بکەو ئابڕووم مەبە .

آلهی نیم ئەگەرچی من حەریفی شعرو ئەهلی بەیت
بە بەیتم لێ قبوڵ فەرموو ، لەبەر ئەم ئەهل‌و بەیتانە (٨١)

چ‌ئەهلێ ئەهلی تەبجیل‌و جەلیل‌و مەدحەتی جبریل
چ‌ئەهلی حوبیان حەبی عەلاجی زوعفی ئیمانە (٨٢)

چ بەیتی خانەی ئازادیی وەکو بەیت العتیقی حەق
چ‌بەیتی خانەی شادیی وەکو جیێ وەصلی جانانە (٨٣)

چ‌بەیتی مەجمعی عصمەت مطافی زومرەی قدسیی
چ‌بەیتی مەرجعی حەشمەت کە سەد دارای دەریانە (٨٤)

لە هەرجێیەك کەمین بەندەو کەنیزێکی دەری دەرکەوت
چ‌جێگەی خان‌و خاقانە ، چ‌یارای حوورو غلمانە (٨٥)

فیدای ئەو صاحبی بەیتەم بە أهل‌و بەیتەوە فەرمووی
میسالی ئەهل‌و بەیتی من سەفینەی نوح‌و طوفانە (٨٦)

---

(٨١) حەریف : هاوپیشە . بەیت : مەبەست لە بەیت لێرەدا شیعرە . ئەم ئەهل‌و بەیتانە : مەبەست حەزرەتی فاطمەو علی‌و حەسەن‌و حسەینە .

(٨٢) (تبجیل) مەردوم بە گەورە ڕاگرتن . (جلیل) گەورە . مەدحەتی جبریل : مەدحی جبریل . (حُبّیان) : محەبەتیان . حەبی عەلاجی ضعفی ئیمانە : واتە محەبەتی ئەهل‌و بەیتی پێغەمبەر دەرمانە بۆ لاوازیی ئیمان .

(٨٣) خانەی ئازادیی : واتە خانەیەکە کە دەستی لەژێر باری کەسا نی‌یە خوا نەبێ ، وە ئازادو سەربەست‌و سەرفرازە وەك خانەی خوا کە کەعبەیە ، کە ئەو خانەیەش خانەی پێغەمبەرە .

(٨٤) مطافی زمرەی قدسی : واتە طوافگاهی هەموو فریشتەی ئاسمانە . دارا: لەقەبی چەند کەسێکن لە پاشایانی کۆنی ئێران. دەربان: قاپی‌یەوان.

(٨٥) کەمین بەندە : پچوکترین خزمەتکار . کەنیز : کارکەری زڕخریدە . خان : ووتەی ڕێزە بە هێندێ کەس ئەووترێ وەك محمود خان ، کریم خان . خاقان : ووتەیەکە بە هەموو پاشایەك ئەووترێ . یارا : شایستە .

(٨٦) صاحبی بەیت : پێغەمبەرە . سەفینەی نوح طۆفانە : واتە چۆن ئەوانەی دەستیان بە سەفینەی نووح گرت لە تۆفان ڕزگاریان بوو ،

کەسێ لەم فولکەدا جێی گرت ، بەڵی نعم النجاتی گرت
کەسێ دەستی کە لێ بەردا غەریقی گێژی ( عصیانە )(٨٧)

برا لەم کەشتی‌یە هەرکەس بڕا دەستی بڕا دەستی
جەزای « تبّت یدا » کردن بە بەستەو بەستە لێدانە (٨٨)

خوداوەندا مەدە بەر با بە ئاگر ئابڕووی خاکی
بیەخشە عەیب‌و نوقصانی بزرگی بەم بزرگانە

لە زەرّاتی زبانداری هەچی زیرۆح‌و حەیوانە
سەد ئەفلاک‌و زەمین پڕ بێ نەکو هەر ئەم مەکانانە

زبانی هەر یەکێ تەنها هەچی باقی ئەڵێن بیڵێ
بە هەر طەرفەو ، دەقیقەو ، دەم ، بە هەر لەحزەو ، بە هەر ئانە

چوار بەیتێ کە سەرلەوحەی قصیدەم بوو قسەی دەم بوو
بە سۆزی دڵ مکرەر کەن ، ئەمانەو ، چی موسلمانە (٨٩)

---

هەرچیش دەست بە اهل‌و بەیتی پێغەمبەرو هاوڕێیانی پێغەمبەر بگرێ لە ڕۆژی دوایی‌دا ڕزگاری ئەبێ .

(٨٧) فلك : کەشتی .

(٨٨) بڕا دەستی : واتە دەستی لێ بەربوو . بڕا دەستی : واتە دەستی لەبنا قرتا . جەزای( تبت یدا ) کردن : واتە پێی بڵێیت لەناوچێ دوو دەستەت ، وەکو خوا بە ابولهبی مامی پێغەمبەری ووت لەکاتێکا کە بانگی کرد بۆ بڕواهێنان‌و بڕوای نەهێنا .

(٨٩) واتە تا چەند گیان‌لەبەر هەیە لەسەر زەویی لە ووشکانی‌و لە دەریاو لە خەوایا ، سەد ئەوەندەی‌تر لە ئەفلاک‌و زەمیین پڕ بێ لە گیان لەبەران ، وە بە هەموولایەکیان چەندە ئەڵێن ، هەر تاقە یەکێکیان بەتەنیا بەقەد هەموولایەکیان بڵێ . طرفە : چاو لێکنان . دەقیقە : شەست چرکە . دەم : کاتێك . لحظە : چاو تروکانێك . ئان : ئەوساتەیە کە تۆی تیایت، ئنجا ئەمانە هەموو ئەو چوار شیعرانە بڵێنەوە کە سەرەتای چەکامەکەم پێ دامەزراندووە ، وە گەورەترین سڵاواتە کە لەسەر دیداری پێغەمبەرو ئال‌و اصحابی دراوە .

له جارِو خه‌رمه‌نی فضل‌و که‌مالی ( محوی )یا خاکیی
خه‌ریکی خاکه‌رۆیه‌و گوڵ ده‌چێنێ دانه مووررانه (٩٠)

نعوتی أحمدی فه‌رموو ، نه‌مامی سه‌رمه‌دیی هه‌ڵناشت
منی خاکیی که رێم دایم له ده‌وری باخه‌وانانه (٩١)

سروشك ئاوو موژه په‌رژین ، ئومێدی دڵ چ‌غونچه‌ی گوڵ
به چاو چاودێری وه‌ك بلبل بکه‌م ئه‌م ته‌رزه باخانه

تعالی الله چ دهقانه ، جه‌زای غفران‌و رضوانه
ئه‌مه‌رخور بین خودا ئێمه‌ش له سایه‌ی ئه‌م نه‌مامانه (٩٢)

---

(٩٠) جارِ : جێگای هه‌موو دانه‌وێڵه‌یه‌که دروابێته‌وه . خاکه‌رۆ : کۆکردنه‌وه‌ی خه‌رمانه له‌دوای هه‌ڵگرتنی . گوڵ ده‌چێنێ دانه مووررانه : واته وه‌ك دانه‌ی ده‌می مێرووله ، ئه‌م چوار شیعری دوایی‌یه له نسخه‌ی ژماره (٢)دا نیین.

(٩١) نعوت : جمعی نه‌عتی به‌مانا وه‌صفی شتێکه به‌چاکیی . سه‌رمه‌دیی : ووته‌یه‌کی عه‌ره‌بی‌یه به‌شتێك ئه‌ووترێ که ئه‌به‌دیی بێ . هه‌ڵناشتن : ناشتن، واته ئه‌م چه‌کامه‌یه‌م ووت له نه‌عتی پێغه‌مبه‌را ، وه چه‌ند نه‌مامێکی ئه‌به‌دییم بۆ خۆم ناشت تا گه‌وره ببن ، وه له رۆژی دوایی‌دا به‌رێکی شیرین‌و خۆشم بۆ بگرێ که شه‌فاعه‌تی پێغه‌مبه‌ره « دروودی خوای لێ بێ » .

ئنجا ئه‌م نه‌مامانه ئاو ئه‌ده‌م به فرمێسکی اخلاص ، وه به برژانگی چاو به‌رژینی بۆ ئه‌که‌م‌و چاودێریی ئه‌که‌م ، بۆئه‌وه‌ی له‌جیاتی غونچه‌ی گوڵم بۆ بگرێ ، ئومێدی دڵم بێنێته‌دیی که شه‌فاعه‌تی پێغه‌مبه‌ره .

(٩٢) تعالی الله : نامه خوا . دهقان : تۆوکه‌ری کشتیار ، واته نامه‌خوا خاکیی چ‌کشتیارێکی ئاودێره ، که‌وا نه‌عتی محمدیی ئه‌ڵێ‌و نه‌مامی ئه‌به‌دیی ئه‌نێژێ ، وه به برژانگی چاو په‌رژینی بۆ ئه‌کات‌و به فرمێسك ئاوی ئه‌دات، ساخوا به گه‌وره‌یی‌و میهره‌بانی خۆی به‌ره‌که‌یم بۆ بێنێته دیی ، وه له‌سایی ئه‌م نه‌مامانه‌وه ئێمه‌ش به به‌ری کرده‌وه‌ی خۆمان بگه‌ین .